زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# ئیسماعیل پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت





زنجیرەی چیرۆكی پێغەمبەران

# ئیسماعیل پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت

بسم الله الرحمن الرحيم


ناوی نامیلكە: ئیسماعیل پێغەمبەر
(سەلامی خوای لێبێت)
ئامادەكردنی: محمد عەلی قەرەداغی
چاپ و دیزاین: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
تیراژ: ( ٢٠٠٠) دانە
نرخ: ( ١٥٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارەی سپاردنی ( ١٧٦٧) ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە


ARA Media Center

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

(سارە)ی خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام منداڵی نەدەبوو، کاتێ خودا ئیبراهیمی لە ئاگرەکە رزگار کرد، ئیبراهیم عليه السلام و سارە لە دەست نەمروودی ستەمکار هەڵاتن بۆ میصر.
بەسەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیم و رزگاربوونی بێ زیان لەو ئاگرە گەورەی کە نەمروود فڕێی دابووە ناوی، بڵاوبووبووەوەو گەیبووە وڵاتان. کەگەیشتنە میصر خەڵکی شارەکە هەموو خۆشیان ویست و، پاشای میصر کەنیزەکێکی هاجەر ناوی بەخشی بە سارەی خێزانی ئیبراهیم. ئەویش بەخشی بە حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام مارەی کردو خودا لە هاجەر ئیسماعیلی پێ بەخشی.



ئیبراهیم عليه السلام و هەردوو ژنەکەی و ئیسماعیلی کوڕی گەڕانەوە بۆ فەلەستین. پاش ماوەیەك خودا فەرمانیدا بە ئیبراهیم کە ئیسماعیل و هاجەری دایکی ببا بۆ شوێنێکی وشکی بێ ئاوو درەخت، لە نزیکی کەعبە (بیت الحرام) ئەویش بە فەرمانەکەی کرد.



ئیبراهیم (علیه السلام) هاجەرو کوڕەکەی لەو چۆڵە شاخاوییە و بەردەڵانییەدا بەجێ هێشت. کە ئیبراهیم ویستی بگەڕێتەوە هاجەر پێی وت: بەفەرمانی خودا لێرەدا بەجێمان دێڵی؟ فەرمووی: بەڵێ. هاجەر وتی: کەواتە خودا لەناومان نابات.



هاجەر لەو ئاوو خۆراکەی پێی بوو دەیخواردو شیری بە
ئیسماعیل دەدا، کاتێ هیچی پێ نەماو بینی وا کوڕەکەی
لە تینوا دەکوڕووزێتەوە، کەوتە پەلەقاژەو گەڕان بەدوای
ئاودا بۆی و، کەوتە راکردن لەنێوان صەفاو مەروەدا،
حەوت جار ئەمسەرەو سەری کرد.



کاتێ هاجەر گەڕایەوە تا بزانێ کورەکەی چی بەسەر هاتوە بینی ئاو لەژێر پێی ئیسماعیلەوە هەڵدەقوڵێ. لەئاوەکەی خواردەوە و شیریدا بەکورەکەی و، ئەو بیرە لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ سەرچاوەی ئاوە بەناوی (زەمزەم).



هاجەرو کوڕەکەی لەو شوێنەدا مانەوە، تا کۆمەڵێك لەتیرەی (جورهوم) بەلایاندا تێپەڕین، کە ئاوەکەیان بینی داوایان لە هاجەر کرد ڕێگەیان بدات لەلایان بمێننەوەو لە ئاوەکە بخۆنەوە، هاجەریش ڕێگەی دان، لەوەوە مەککە دروست بوو.
ئیسماعیل عليه السلام لەگەڵ منداڵەکانی ئەو تیرەدا گەورە بوو. زمانی عەرەبییان لێوە فێربوو، تیرەکە زۆر ڕێزیان لە ئیسماعیل و دایکی دەگرت و ئیبراهیمیش عليه السلام ناو بەناو سەری دەدان.

جارێکیان کە ئیبراهیم عليه السلام چووبوو بۆ
سەردانی هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی و
ئیسماعیل لاوێکی جوان بوو باوکی پڕ بەدڵ
خۆشی دەویست.. خودای پەروەردگار
ویستی ئیبراهیم تاقی بکاتەوە، ئیبراهیم عليه السلام
لەخەودا بینیی خەریکە ئیسماعیلی کوڕی
سەردەبڕێت.





ئیبراهیم عليه السلام خەوەکەی بۆ ئیسماعیل گێڕایەوە، ئیسماعیلی لاو بەوپەڕی باوەڕی پتەوو ملکەچیی بۆ فەرمانی خوداوە وتی: بابەگیان فەرمانی چیت پێدراوە بەجێی بێنە، بە یارمەتیی خودا دەبینی کە من لە خۆگران دەبم. ئیبراهیم عليه السلام چەقۆی گرت بەدەستەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئیسماعیل سەرببڕێ خودای پەروەردگار بە فریشتەیەکدا بەرانێکی گەورەی بۆ نارد، ئیبراهیم عليه السلام بەرانەکەی کرد بەقوربانی ئیسماعیل.



پاش ئەوە ئیسماعیل عليه السلام گەورە بوو و
بوو بەگەنجێکی لێهاتوو خودا فەرمانیدا
بە ئیبراهیم کە کەعبە دروست بکەن و،
ئیسماعیل کۆمەکی باوکی بکات.
ئیبراهیم عليه السلام بەکۆمەکی ئیسماعیل
کەعبەیان دروستکرد.



دوای ئەوە خودای پەروەردگار
ئیسماعیلی عليه السلام کرد بە پێغەمبەرو
فەرمانێ پێدا پەیامی خودا بگەیەنێ
بەخەڵك، ئەویش فەرمانەکەی
جێبەجێ کرد تا کۆچی دوایی
کرد.